# ناوەڕۆک

بنچینەی IP Address

مەرجەکانی Octet

بنچینەی TCP/IP

دابەشکردنی ئایپی بەسەر پۆلەکاندا Class

دابەشکردنی ئایپی بەسەر وەشانەکانیدا Version

چۆن ناونیشانی ئایپییەکەمان دەزانین

تۆڕ Network

ناونیشانی ئایپییە تایبەتییەکان

کەمێک لە بارەی CIDR

ئایپی شاردنەوە !!!

سەرچاوەکان

# بنچینەی IP Address

ئایپی ئەدرەس ‘IP’ کورتر کراوەی هەردوو وشەی ‘Internet Protocol’ کە پێکدێت لە چوار خانەی ژمارەی بە خاڵ لێك جوداکراو.

| خانەی چوار | خانەی سێ | خانەی دوو | خانەی یەك |
| --- | --- | --- | --- |

______.________.________.________ نمونە 180.55.72.6

‘Address’ کاری گۆرینی ژمارەی ئایپیەکانە بۆ بەستەر.

کارێکی زۆر گرانە ژمارە ئایپی هەموو ماڵپەڕەکان لەیادمان بمێنت، بەڵام ئەدرەس-ناونیشان، ژمارەکانی ئایپی دەگۆڕێت بۆ ناونیشان، هەموو ماڵپەڕ و ئامێرێکی پەیوەست بە تۆڕەوە ژمارە ئاپییەکی تایبەتی هەیە.

(ئەو ئایپیە خەیاڵییە ئایپی فەیسبووك نیە تەنها بۆ رونکردنەوەیە)

166.86.65.37 ⟵ www.facebook.com

## ئایپی ئەدرەس چییە؟

هەروەك چۆن هەموو شەقامێك ژمارەیەکی تایبەتی هەیە یان هەر تەلەفونێك ژمارەیەکی تایبەتی هەیە، ئەوا هەر ئامێرێك پەیوەندی بکات بە ئینتەرنێتەوە ژمارەیەکی تایبەتی هەیە (بۆ دروست دەبێت) کەپێی دەوترێت ئایپی ئەدرەس، وە ئایپی پێکدێت لە چوار خانە کە بەخاڵ لێك جودا کراونەتەوە، هەر خانەیەك پێی دەوترێت "Octet" وە گەورەترین ژمارەی “Octet” بریتییە لە 255

چەند نمونەیەکی ئایپی:

—.—.—.—

156.7.98.2

79.44.37.3

46.72.31.8

# مەرجەکانی Octet

دەبێت خانەی ئایپی ئەم مەرجانەی هەبێت ئینجا پێی دەوترێت Octet

1- یەکەم ژمارە نابێت سفر بێت

2- یەکەم خانەی ئایپی نابێت بە ژمارە 127 دەست پێبکات.

3- نابێت هیچ لە چوار خانەکەی ئایپی لە 255 تێپەڕ بکات.

# بنچینەی TCP/IP

بۆ پێکەوە بەستنی نەزمە جیاوازەکان "ویندۆس، لینۆکس، ماکنتۆش..." و ئاڵوگۆڕی زانیاری لە نێوانیاندا TCP/IP بەرهەم هێنرا .

"TCP/IP" کورتکراوەی "Internet Protocol/Transmission Control Protocol" کە ڕێکخراوی ARPA لە ساڵی 1970 هەرهەمی هێنا وە دواتر ئەم ڕێکخراوە ناوی گۆڕدرابە Darpa ، ئەم ڕێکخراوە بێ لایەنە و هەموو کەس دەتوانێت پەیوەستی ئینتەرنێت بێت بە هەرجۆرە کۆمپیوتەرێکەوە بێت، ئێستا کۆمەڵێك پرۆتۆکۆڵی دیکەش دروست بوون هەر لەسەر بناغەی پرۆتۆکۆڵی TCP/IP گرنگترینیان؛

1- SMTP-Simple Mail Transfer Protocol

کۆنترۆڵ کردنی وەرگرتن و ناردنی نامەی ئەلیکترۆنی دەکات.

2- FTP-File Transfer Protocol

گۆڕینەوەی پەڕگە (فایل) لەنێوان کۆمپیوتەرەکاندا.

3- HTP-Hypertext Transfer Protocol

بڵاوکردنەوەی زانیاریەکان لەسەر تۆڕی جیهانی ئینتەرنێت (تۆڕی جاڵجاڵۆکەی جیهانی)

WWW-World Wide Web

# دابەشکردنی ئایپی بەسەر پۆلەکاندا Class

بۆ ئەوەی زۆر ترین ژمارەی ئایپی دروست بکرێت و بەکارهێنەرانی تۆڕ (ئینتەرنێت) کێشەیان بۆ دروست نەبێت ئایپی وەشانی چوار دابەشکرا بەسەر پێنج پۆلدا:

**پۆلی ئەی Class A : ئەم پۆلە خانەی یەکەمی ئایپیەکانی لەنێوان ژمارە یەك بۆ سەد و بیست و شەش دایە.**

**Class A 1-126**

**Subnet Mask to Class A: 255.0.0.0**

**پۆلی بی Class B : ئەم پۆلە خانەی یەکەمی ئایپیەکانی لەنێوان ژمارە سەد و بیست و هەشت بۆ سەد و نەوەد و یەك دایە.**

**Class B 128-191**

**Subnet Mask to Class B: 255. 255.0.0**

**پۆلی سی Class C : ئەم پۆلە خانەی یەکەمی ئایپیەکانی لەنێوان ژمارە سەد و نەوەد و دوو بۆ دووسەد و بیست و سێ دایە.**

**Class C 192-223**

**Subnet Mask to Class C: 255. 255. 255.0**

**پۆلی دی Class D : ئەم پۆلە خانەی یەکەمی ئایپیەکانی لەنێوان ژمارە دووسەد و بیست و چوار بۆ دووسەد و سی و نۆ دایە.**

**Class D 224-239**

**پۆلی ئی Class E : ئەم پۆلە خانەی یەکەمی ئایپیەکانی لەنێوان ژمارە دووسەد و چل بۆ دووسەد و پەنجا و چوار دایە.**

**Class E 240-254**

# پۆلەکانی ناونیشانی پرۆتۆکۆڵی ئینتەرنێت - IP address classes

| Class | 1st Octet Decimal Range | 1st Octet High Order Bits | Network/Host ID (N=Network, H=Host) | Default Subnet Mask | Number of Networks | Hosts per Network (Usable Addresses) |
|---|---|---|---|---|---|---|
| A | 1 – 126* | 0 | N.H.H.H | 255.0.0.0 | 126 ($2^7$ – 2) | 16,777,214 ($2^{24}$ – 2) |
| B | 128 – 191 | 10 | N.N.H.H | 255.255.0.0 | 16,382 ($2^{14}$ – 2) | 65,534 ($2^{16}$ – 2) |
| C | 192 – 223 | 110 | N.N.N.H | 255.255.255.0 | 2,097,150 ($2^{21}$ – 2) | 254 ($2^8$ – 2) |
| D | 224 – 239 | 1110 | Reserved for Multicasting | | | |
| E | 240 – 254 | 1111 | Experimental; used for research | | | |

**ڕونکردنەوەی ئەم خشتەیە:**

⋆ **Class** - پۆلەکان وەك لەسەرەوە ڕونمانکردەوە پێنج پۆلی ئایپیمان هەیە.

⋆ **1st Octet Decimal Range** - مەودای خانەی پۆلەکانی ئایپی، بۆ نمونە پۆلی ئەی 1-126 واتە پۆلی ئەی ئایپییەکانی لە نێوان ژمارە یەك تا سەد و بیست و شەشدایە.

⋆ **1st Octet High Order Bits** - بەرزترین فەرمانی بیت بۆ پۆلی ئەی ژمارە سفرە وە بۆ پۆلی بی ژمارە دەیە .....

⋆ **Network/Host ID** - ئایپی پێك دێت لە دووبەش بەشی یەکەم نیێتۆرك-تۆڕ وە بەشی دووەم

هۆست-خانەخوێ.

**N.H.H.H** پۆلی ئەی یەکەم خانەی ئێنە وە خانەکانی تری ئێچن، سەیری پۆلەکانی تربکە لە خشتەکەدا.

**N=Network & H=Host**

**126.65.77.9** ئێستا ئەم ناونیشانی ئایپییە بە 126 دەست پێدەکات کەواتە سەر بە پۆلی ئەیە، وە لەپۆلی ئەیدا یەکەم خانە "**Network ID**"ە کەواتە دابینکەری خزمەتگوزاری ئینتەرنێت ئایپیەکەی بە 126 دەست پێدەکات (نمونە: کۆمپانیای تیشك نێت).

سێ خانەکەی تری ئایپی "**Host ID**"ە پێناسی بەکارهێنەری خانە خوێیە، واتە تایبەتە بە بەکارهێنەر.

"ئەوانەی هێڵیان لەیەك دابینکەری خزمەتگوزاری ئینتەرنێتەوە وەرگرتبێت بۆ پۆلی ئەی هەمیشە خانەی یەکەم ئایپییەکەیان وەك یەکە، سەیری خشتەکە بکە بۆ پۆلەکانی دیکەش"

سەیربکەن خانەی یەکەمی دابینکەری ئینتەرنێت 192 کەواتە سەر بە پۆلی سییە، کەواتە سێ خانەی یەکەم سەر بە تۆڕە(دابینکەری ئینتەرنێت)ە خانەی چوارەم تایبەتە بە خانەخوێ(بەکارهێنەر)، وەك دیارە لە کۆمپیتەرێکەوە بۆ کۆمپیتەرێکی تر تەنها خانەی چوارمی ئایپی گۆڕاوە و سێ خانەکەی تر جێگیرە
N.N.N.H




⋆ **Default Subnet Mask** - ڕوپۆشی بنەڕەتی تۆڕی ناسەرەکی(دووەمی)بەهۆی سەبنێت ماسکەوە دەتوانین بێ بینینی ئایپی پۆلەکەی دیاری بکەین، بۆ نمونە سەبنێت ماسکی 255.0.0.0 ئەوا دەزانین کە ئایپی ئەم سەبنێت ماسکە سەر بە پۆلی ئەیە، پۆلی ئەی و بی و سی سەبنێت ماسکیان هەیە، بەڵام پۆلی دی بۆ پارێزگارییە وە پۆلی ئی بەکاردێت بۆ توێژینەوە کەواتە پۆلی دی و ئی ئایپییەکانیان بۆ کۆمپیتەر بەکارنایەت کەواتە سەبنێت ماسکیان نییە.

⋆ **Number of Networks** - ژمارەی تۆڕەکان، بۆ نمونە پۆلی ئەی دەتوانین 126 تۆڕی لەسەر دروست بکەین.

⋆ **Hosts per Network** - خانەخوێ لە تۆڕدا (ناونیشانی گونجاو بۆ بەکارهێنان)، بۆ نمونە پۆلی ئەی دەتوانین 16,777,214 شازدە ملیۆن و حەوسەد و حەفتاو حەوت هەزار و دوسەد و چواردە ناونیشانی ئایپی دروستبکات (بەکارهێن لەسەر ئەم پۆلە پێك بهێنرێت).

"$2^8$-2" واتە دوو بەتوانی هەشت ئەنجامی دەرچوو دوو ژمارەی لێدەردەکەین، دوو توان هەشت دەکاتە دوسەد و پەنجا و هەشت کەم دوو دەکاتە 254 ئەم ژمارە ناونیشانی گونجاوی بەکارهێنانی پۆلی سییە.

”Default Subnet Mask و Number of Networks و Hosts per Network

پۆلی دی و ئی نییانە چوونکە بۆ کۆمپیتەر بەکارنایەن "

# دابەشکردنی ئایپی بەسەر وەشانەکانیدا Version

**ئایپی دوو جۆر وەشانی هەیە:**

## یەکەم: ئایپی وەشانی چوار کە بەم شێوەیە هێما دەکرێت IPV4

**ئایپی وەشانی چوار، لە چوار خانەی ژمارەی (هەموو ژمارەکان 0 تا 9) پێك دێت، کە بە خاڵ لێك جودا کراونەتەوە، کە لە نێوان ژمارە 0 تا 255 دایە، وەشانی چوار سەرچاوەی گرتووە (هاتووە) لە 32 بت (4 بایت).**

**زیاتر: هەر خانەیەکی ئایپی (8Bit)ە وە 8 بت دەکاتە (1Byte)، کەواتە چوار خانەی ئایپی کە هەر خانەیەکی 8 بتە دەکاتە 32 بت وە 32 بتیش دەکاتە 4 بایت.**

**8bit+8bit+8bt+8bit=32bits**

**8bit=1byte ⇨ 32bits/8 =4Bytes**




**نمونەیەکی ئایپی وەشانی چوار 10.20.30.1**

## دووەم: ئایپی وەشانی شەش کە بەم شێوەیە هێما دەکرێت IPV6

**ئایپی وەشانی شەش، لە هەشت خانەی ژمارەکان (0 تا 9) و پیتەکان (ئەی تا ئێچ)، پێك دێت کە بە دوو خاڵ لێك جودا کراونەتەوە، زەخیرە کردنی 128 بت یا (16 بایت).**




**نمونەیەکی ئایپی وەشانی شەش fff:0000:0a88:85a3:0000:0000:ac1f:80011**

ت1/نەزمی دووانی لە (0 و 1) پێکدێت، نەزمی دەی لە (0 تا 9) پێك دێت، نەزمی شازدەی(هێکسا) لە (0 تا 9 وە ئەی تا ئێف) پێکدێت.

| 10 Dec | 2 Bin | 16 Hex |
|---|---|---|
| 0 | 0000 | 0 |
| 1 | 0001 | 1 |
| 2 | 0010 | 2 |
| 3 | 0011 | 3 |
| 4 | 0100 | 4 |
| 5 | 0101 | 5 |
| 6 | 0110 | 6 |
| 7 | 0111 | 7 |

| 10 Dec | 2 Bin | 16 Hex |
|---|---|---|
| 8 | 1000 | 8 |
| 9 | 1001 | 9 |
| 10 | 1010 | A |
| 11 | 1011 | B |
| 12 | 1100 | C |
| 13 | 1101 | D |
| 14 | 1110 | E |
| 15 | 1111 | F |

ت2/یەکەی پێوانەکانی کۆمپیتەر، هەندێکی

| | |
|---|---|
| 8 bits (b) | 1 byte |
| 1024 bytes (B) | 1 kilobyte |
| 1024 kilobytes (KB) | 1 Megabyte |
| 1024 Megabyte (MB) | 1 Gigabyte |
| 1024 Gigabyte (GB) | 1 Terabyte |
| 1 Terabyte (TB) | 8,796,093,022,224 bit |

# چۆن ناونیشانی ئایپییەکەمان دەزانین

بۆ ئەوەی  ناونیشانی ئایپییەکەمان بزانین، دەتوانین بەدوو شێواز ئەم کارە ئەنجام بدەین.

یەکەم لەڕێگای ئەو نەزمەوەی کە بەکاری دێنین:

ئەگەر نەزمی دویندۆس بەکاردێنیت، دەتوانیت لە ڕێگەی بەرنامەی CMD ئایپییەکەتان بزانن، بۆ ئەوەی بەرنامەکە بکەنەوە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکە:

## ڕێگای یەکەم

هەنگاوی یەکەم کرتە لە Start بکە.

هەنگاوی دووەم کرتە لە All Programs بکە.

هەنگاوی سێیەم کرتە لە Accessories بکە.

هەنگاوی چوارەم کرتە لە Command Prompt بکە.

## ڕێگای دووەم

هەنگاوی یەکەم کرتە لە Start بکە.

هەنگاوی دووەم کرتە لە Run بکە.

هەنگاوی سێیەم  لە Runدا بنوسە CMD و پاشان Enter.

ڕێگای یەکەم یان دووەم یان هەر ڕێگایەکی تر ئەوا ئەم پەنجەرە ڕەشەمان بۆ دەکرێتەوە.



لەپاش کرانەوەی بنوسە Ipconfig پاشان Enter




وێنەکەمان کۆمەڵێك زانیاری تێدایە، با کەمێك لەسەر ئەو وێنەیە بدوێین:

**هێڵی سور:** شێوازی پەیوەست بوونی کۆمپیتەرەکەمان بە تۆڕەوە لە جۆری وایەرلێستە.

**هێڵی سەوز:** بەستەر-ناوچەی ناونیشانی ئایپی وەشانی شەش.

**هێڵی زەرد:** ناونیشانی ئایپی وەشان چوارەکەمانە.

**هێڵی شین:** ڕووپۆشی ناسەرەکی(دووەمی) ئینتەرنێتەکەمانە.

**هێڵی شینی کاڵ:** ئایپی ڕاوتەر-دابینکەری خزمەتگوزاری ئینتەرنێتەکەمانە (ئەو ئامێرەی تۆڕەکەی دروست کردوە).

ت1/ئەم زانیاریانە تۆڕی ناوخۆییە نەك تۆڕی ئینتەرنێت، واتە تەنها لە موبایلێکەوە تۆڕێکم دروست کردووە و لە کۆمپیتەرەکەمەوە وەرم گرتووە، ئەگینا زانیاری زیاتری بۆ دەنوسین سی ئێم دی.

ت2/بۆ زانینی ئایپی ماڵپەرەکان لە سی ئێم دیدا بنوسە ping ****.com لەدوای پینگ بۆشاییەك بە جێبهێڵە پاشان ناونیشانی ماڵپەڕەکە بنوسە، بەم شێوە ping fb.com .

## دووەم لەڕێگای ماڵپەرەکانی ئینتەرنێتەوە

کۆمەڵێك ماڵپەڕی زۆر هەیە کە پێت ئەڵێت ناونیشانی ئایپییەکەت چەندە، ناونیشانی چەند ماڵپەڕێك لێرەدا دەنووسین:

**ماڵپەڕی یەکەم:** ئەم ماڵپەرە ناونیشانی ئایپییەکەتت پێدەڵێت، وە هەر لەم ماڵپەڕەوە دەتوانی بزانی چ پۆرتێکت کراوەتەوە.

http://www.canyouseeme.org

**ماڵپەڕی دووەم:**

http://whatismyipaddress.com

**ماڵپەڕی سێیەم:**

https://www.whatismyip.com

**ماڵپەڕی چوارەم:**

https://www.iplocation.net

**What My IP Says About Me**

**Your IP Address Is: 131.*.*.***

City: ****
State/Region: As *****
Country: iq -
Postal Code: -
Host Info
ISP: Al Sard Trading Agencies Co. Limited
Host Name: *.*.*.*
Browser Info
Mozilla/5.0 (Windows NT 6.1) AppleWebKit/537.36 (KHTML, like Gecko) Chrome/42.0.0.10338 Safari/537.36
Geolocation Info
Time Zone: ETC +03:00
Latitude: ** *************
Longitude: ** ***********

*General IP Information*

| | |
|---|---|
| IP: | *.*.*.* |
| Decimal: | 2205540704 |
| Hostname: | *.*.*.* |
| ASN: | ***** |
| ISP: | **** Company for **** technology and Interne |
| Organization: | **** internet subscriber |
| Services: | None detected |
| Type: | Broadband |
| Assignment: | Static IP |
| Blacklist: | |

*Geolocation Information*

| | |
|---|---|
| Continent: | Asia |
| Country: | Iraq |
| Latitude: | ** (**° 0′ 0.00″ N) |
| Longitude: | ** (**° 0′ 0.00″ E) |

ttp://www.ripe.net/whois
http://swhois.net

ت[1]/ پێت دەڵێت ئایپییەکەت و وڵات...هتد، زانیاری بزانە دەربارەی ئایپییەکانی تر لەو دوو ماڵپەڕەوە.

ت[2]/ پۆرت واتە دەرچە بۆ هەر کارێك و دەرچەیەکمان هەیە، وەك دەرچەی میمۆری و دەرچەی بینینی پەڕەکانی ماڵپەڕ و ...هتد.

پ[3]/ هەر یەك لەو دوو ڕێگایە سودی خۆی هەیە، بۆ نمونە لە کاتێك خۆت تۆڕ دروست دەکەیت ئەوا لە ڕێگەی سی ئێم دیەوە دەزانی ئایپییەکەت چەندە، ماڵپەڕەکان ناکرێنەوە، وە ماڵپەڕەکانیش کۆمەڵێك زانیاریت پێ دەڵێن کە زیاترە لە سی ئێم دی، وە دەتوانی لەڕێگای بەرنامە یان ماڵپەڕەکانەوە ئایپی ماڵپەڕەکانی تر بزانی.

**نەزم – نظام - System**

# Network - تۆڕ

ئێمە کە باسی ئایپی دەکەین گرنگی لەوەدایە کە بەهۆی ئایپییەوە دەتوانین تۆڕێکی گەورە پێك بهێنین، ئایپی بێ تۆڕ تەنها ژمارەیەکە و هیچی تر وە تۆڕیش بێ ئایپی نابێت، جا باکەمێك دەربارەی تۆڕ بدوێین.

تۆڕ بریتییە لە پێکەوە بەستنی دوو ئامێر (کۆمپیتەر، موبایل، کاتژمێری زیرەك....) یان زیاتر، جا بەهۆی کێبڵەوە بێت یان بێ کێبل وەك بلوتوس وایەرلێست بۆ ئاڵوگۆڕی داتاکانی (وێنە، ڤیدیۆ، دەنگ....) بێ ئەوەی پێویستیمان بە فلاش یان میمۆری یان سیدی یان فلۆپی ... هەبێت.

## جۆرەکانی تۆڕ

1-LAN-Local Area Network تۆڕی ناوخۆی بچوك.

2-MAN-Metropolitan Network چەند تۆڕێکی بچوك (ناوخۆی).

3-WAN-Wide Are Network یەك گرتنی چەند مانێك وەك تۆڕی ئینتەرنێت.




تۆڕێکی بچوك بەهۆی کێبڵەوە



نمونەی تۆڕێك

بەهۆی کێبڵەوە

تۆڕێك بەهۆی وایەرلێستەوە




# ناونیشانی ئایپییە تایبەتییەکان

لە تۆڕی جاڵجاڵۆکەی جیهانیدا یان کاتێك خۆمان تۆڕێك دروست دەکەین، کۆمەڵێك ئایپی تایبەتی هەن کە ناتوانین بەکاریان بهێنین، وە کۆمەڵێك ئایپی هەن یاساکان نایانگرێتەوە و تایبەتن، لێرەدا ئاماژەیان پێ دەکەین.

## ئایپیە تایبەتییەکان Private IP Addresses

| Class | Private Networks | Subnet Mask | Address Range |
| --- | --- | --- | --- |
| A | 10.0.0.0 | 255.0.0.0 | 10.0.0.0 - 10.255.255.255 |
| B | 172.16.0.0 - 172.31.0.0 | 255.240.0.0 | 172.16.0.0 - 172.31.255.255 |
| C | 192.168.0.0 | 255.255.0.0 | 192.168.0.0 - 192.168.255.255 |

**لە پۆلی ئەیدا** ئایپی **10.0.0.0** تا **10.255.255.255** تایبەتن.

**لە پۆلی بیدا** ئایپی **172.16.0.0** تا **172.31.255.255** تایبەتن، وە ڕووپۆشی ناسەرەکیشیان خانەی دووەمی لە جیاتی **255** وەك دەبینین **240**.

**لە پۆلی سیدا** ئایپی **192.168.0.0** تا **192.168.255.255** تایبەتن، وە ڕووپۆشی ناسەرەکیشیان دەبوایە خانەی سێیەم **255** بوایە، بەڵام ژمارە سفرە.

له 169.254.0.0 تا 240-254 Class E تایبەتە بۆ APIPA بەشێوەیەکی خودکار ئایپی

بەکارهێنانی گونجاوی تۆڕ دروست دەکات بەبێ ڕێکخستن.

**APIPA= Automatic Private IP Address**

**ئایپیە قوفڵ دراوەکان Loopback ئەمانەش ناتوانین بەکاریان بهێنین**

هەر خانەیەکی ئایپی کە بە 127 دەستپێبکات 127.*.*.*

ئایپی 127.0.0.1 یا http://localhost بەکاردێت بۆ تاقیکردنەوەی بەرنامە(سکریپت) پێش ئەوەی بخرێتە سەر سێرفەری تۆڕ.




**پۆلی دی لە 224 بۆ 247 دانراون بۆ Multicase**

**پۆلی ئی لە 248 بۆ 255 دانراون بۆ (ئەزموونی-توێژینەوە) Experimental**

**پۆلی دی و ئی بەکارنایەت بۆ کۆمپیوتەر.**

# کەمێك لە بارەی CIDR

وشەی CIDR کورتکراوەی وشەکانی "Classless Inter-Domain Routing " وەك چۆن کۆمپیتەری ئاسایی ئایپی تایبەتی هەیە، بەو شێوەیەش تۆڕ ئایپی و سەبنێت ماسکی تایبەتی هەیە.

| Class | Network Address | Number of Hosts | Netmask |
|---|---|---|---|
| CIDR | /4 | 240,435,456 | 240.0.0.0 |
| CIDR | /5 | 134,217,728 | 248.0.0.0 |
| CIDR | /6 | 67,108,864 | 252.0.0.0 |
| CIDR | /7 | 33,554,432 | 254.0.0.0 |
| A | /8 (1-126) | 16,777,216 | 255.0.0.0 |
| CIDR | /9 | 8,388,608 | 255.128.0.0 |
| CIDR | /10 | 4,194,304 | 255.192.0.0 |
| CIDR | /11 | 2,097,152 | 255.224.0.0 |
| CIDR | /12 | 1,048,576 | 255.240.0.0 |
| CIDR | /13 | 524,288 | 255.248.0.0 |
| CIDR | /14 | 262,144 | 255.252.0.0 |
| CIDR | /15 | 131,072 | 255.254.0.0 |
| B | /16 (128-191) | 65,534 | 255.255.0.0 |
| CIDR | /17 | 32,768 | 255.255.128.0 |
| CIDR | /18 | 16,384 | 255.255.192.0 |
| CIDR | /19 | 8,192 | 255.255.224.0 |
| CIDR | /20 | 4,096 | 255.255.240.0 |
| CIDR | /21 | 2,048 | 255.255.248.0 |
| CIDR | /22 | 1,024 | 255.255.252.0 |
| CIDR | /23 | 512 | 255.255.254.0 |
| C | /24 (192-223) | 256 | 255.255.255.0 |
| CIDR | /25 | 128 | 255.255.255.128 |
| CIDR | /26 | 64 | 255.255.255.192 |
| CIDR | /27 | 32 | 255.255.255.224 |
| CIDR | /28 | 16 | 255.255.255.240 |
| CIDR | /29 | 8 | 255.255.255.248 |
| CIDR | /30 | 4 | 255.255.255.252 |

بۆ زیاتر تێگەشتن کەمێك لەسەر هێڵە سورەکە دەدوێین.

**Class a** پۆلی ئەی: ژمارەی خانەی یەکەمی ئەم پۆلە لە نێوان 1 تا 126 دایە.

**Network Address** ناونیشانی تۆڕ: لە نێوان ژمارە 8 تا 15 دایە.

**Number of Hosts** ژمارەی خانەخوێکان بۆ تۆڕی 8 دەکاتە 16,77,216 یە.

**Netmask** ڕوپۆشی تۆڕ بۆ تۆڕی 8 دەکاتە 255.0.0.0

نمونە < 192.66.32.7/24

192.66.32.7 IP

/24 Mask Bits

192.66.32.0 CIDR Network

192.66.32.0/24 CIDR Notation

192.66.32.0-192.66.32.255 Address Range

# ئایپی شاردنەوە !!!

## بۆچی خەڵك ئایپییەکانیان دەشارنەوە؟

**یەکەم:** شاردنەوەی ناسامە لە دابینکەری خزمەتگوزاری ئینتەرنێت، لەوانەیە دابینکەر چاودێریت بکات و ناسنامەت ئاشکرابکات.

**دووەم:** شاردنەوەی شوێنی جوگرافی، دابینکاری تۆڕ شوێنی جوگرافیت دیاری دەکات، وە شوێنی بەکارهێنانت ئاشکرایە کە ئەمەش گرفتە.

**سێیەم:** جێنەمانی شوێن پێت، سەردانی هەر ماڵپەڕ و یانەیەك بکەیت لەلایەن دابینکەری ئینتەرنێتەوە تۆماردەکرێت.

**چوارەم:** کردنەوەی ماڵپەڕە قەدەغەکراوەکان، هەندێك ماڵپەڕ دابینکەری ئینتەرنێت قەدەغەی کردنەوەیان دەکات، یان هەندێك یاری (نمونە وارکۆماندەر) و یانە (نمونە هاك فۆرمس) خزمەتگوزاری بۆ ئەو وڵاتەی کە پەیوەستی ئینتەرنێت بویت خزمەتگوزاری پێشکەش ناکەن(ئەگەر لە عێراقبیت ناکرێنەوە).

## ناونیشانی ئایپیەکەمان بشارینەوە؟چۆن ئایپی بشارینەوە؟

ناتوانم بڵێم بەڵێ یان نەخێر ئایپییەکەت بشارەوە، بەڵام کەمێك دەدوێم لەم بارەیەوە.

**یەکەم:** بەشاردنەوەی ئایپییەکەت دەتوانی زیاتر لە نێو تۆڕی ئینتەرنێتدا بگەڕێیت.

**دووەم:** دەتوانی سەردانی هەموو ماڵپەڕێك بکەیت، ناونیشانی ئایپی راستەقینەت لە یانە و ماڵپەڕەکاندا جێنامێنێت.

**سێیەم:** دەتوانی شوێنی جوگرافیت (نیشتەجێ بوونت) بشاریتەوە، خۆت لە دابینکەری ئینتەرنێت بشاریتەوە.

**چوارەم:** ئەگەر دابینکەر پۆرتی ویستراوتی داخست بوو، دەتوانیت هەرچ پۆرتێکت بوێت بیکەیتەوە.

**بەڵام ئایا ئەو بەرنامەی ئایپی پێدەگۆڕیت، بەرنامەیەکی متمانەپێکراوە ؟ ئاگاداربە!**

## چۆن ئایپی بشارینەوە؟

**یەکەم:** ئایپی گۆڕین(شاردنەوە)، بۆ نمونە دەمانەوێت ماڵپەڕێك کە(بلۆککراوە یان بلۆکی کردوین) بیکەینەوە، یان گۆڕینی شوێنی جوگرافیمان.

**دووەم: ڤی پی ئێن و پرۆکسی، کردنەوەی پۆرت، گۆڕینی ئایپی......**

من ناتوانم هیچ بڵێم کارەکەی تۆ بڕیاردەدات، گریمان دەتەوێت پۆرتێك بکەیتەوە بەڵام لە هێڵەکەت(نمونە فاست لینك) داخراوە، لەم کاتەدا دەبێت ڤی پی ئێن بەکاربێنیت کە دوو جۆری هەیە (بەلاش لە 3 بۆ 30 رۆژ و دواتر لەکاردەکەوێت یان بەپارە کە مانگانە یان ساڵانە دەبێت پارە بدەیت).

## "Virtual Private Network ـ VPN" هەندێك ڤی پی ئێنی بەلاش

http://cyberghostvpn.com

http://www.usaip.eu/en/free_vpn.php

http://thefreevpn.com/

http://www.vpntool.com/services.php

http://wwwsecuritykiss.com/sk/index.php

http://anchorfree.com/downloads/hotspot-shield

http://proxpn.com

http://openvpn.net

http://www.justfreevpn.com

http://fvpn.com

http://vpnium.com

https://torvpn.com/information.html

http://itshidden.com

## Proxies هەندێك پرۆكسی بەلاش

http://proxify.com

http://www.hidemyass.com

http://hidefromyou.com

http://proxy6.org

http://www.httpsurf.com

http://www.safersurfing.net

http://unblocked.in

http://www.proxeasy.com/webclient.aspx

http://newipnow.com

## بەرنامە بۆ شاردنەوەی ئایپی بە بەلاش، نمونە بەرنامەی Free Hide IP




ت[1]/وەشانی بەلاشە، بەڵام وەشانی پارەی بکڕیت بەدڵنیاییەوە باشتر و بەهێزترە.

ت[2]/ئایپی دوو جۆری هەیە، جێگیر و گۆڕاو (واتە ئێستا ئایپیەکت هەیە و کاتێکی تر ئایپییەکی تر).

**تکایە ئایپیەکەت بپارێزە ژمارەی ئایپیەکەت بە کەس مەڵێ.**

**"ناونیشانی ئایپییەکەت لە یانە و مەکۆکان زەخیرە دەبێت و خاوەن یانە دەتوانێت ئایپیەکەت ببینێت!!"**

# سەرچاوەکان

**یەکەم: سیدی - فێرکاری نێتۆرك-م.ئەرکان کەلاری**

**دووەم: بەرنامەی موبایل (نەزمی ئەندرۆید)**

**IP Network Calculator- android.orbitingpluto.net**

**IP Calculator- Developer: M.Janmaleki**

**سێیەم: پەرتوکەکان**

**چۆن دەبیتە ئەنۆنیمۆس مان-ئێس دی ئێف.**

**تۆڕ-ئارام عوسمان.**

**چۆن دەبیتە هاکەرێکی سەرکەوتوو-هەردەوان نەقشبەندی.**

**چوارەم: ماڵپەڕەکان**

**www.yeane.org**

**www.vlsm-calc.net**

**www.zkurd.org**

**www.ar.wikipedia.org**

**www.iplocation.net**

**www.whatismyipaddress.com**

**www.whatismyip.com**

# ڕونکردنەوەیەك

**ئەم پەرتوكەی بەردەستت هیچ مافێكی نەپارێزراوە، دەتوانیت ناوی پەرتوك یا نوسەر یا ناوەڕۆكی پەرتوك بگۆڕیت و بە هەر شێوازێك پێت باشە بڵاوی بكەیتەوە؟**

**مەڵێ بۆ؟**

**من پێم باشە تاكی كورد كە دەگەڕێت بەدوای زانیاریدا، چەند سەرچاوەیەكی جیاوازی بێتە بەردەست، ئەم كارەم هەوڵێكە بۆ بڵاوكردنەوەی كۆپی لێفت لەناو كورددا، ئەم پەرتوكە لە بلۆگەكەمدا دادەنێم بەشێوازی پەرگەی مایكرۆسۆفت ئۆفیس وۆردی 2003 (دی ئۆ سی)، تۆی بەڕێز دەتوانیت دایبگریت و پەرەی پێبدەیت و پاشان بڵاوی بكەیتەوە بۆ ئەوەی تاكی كورد ئەوەندە ئەم ڕستە بێتامەی نەدرێت بەڕودا (زمانی كوردی، زمانی زانست نیە) كاتێك داوای زانیارییەك دەكات بەزمانی كوردی.**

# بەرهەمەكانمان

| ناوی پەرتووك | نوسەر | بەرواری بەرهەم هێنانی |
|---|---|---|
| هەڵبژاردەیەك لە نوكتەكانی ئەحوّل | م.بەرزەوەند | 2015/11/9 |
| بەرەو جیهانی ڕۆح | عادل فەرهاد | 2015/11/10 |
| كوفر و ئیمان و سیاسەتی نێونەتەوەیی ئیسلام | فیصل ابراهیم ولی | 2015/12/7 |
| فێرگەی زمانی كوردی | عەبدول موتەلیب | 2016/1/26 |
| IP Address بە كوردی | نەیثەن ئیلیز | 2016/1/29 |

